# زەلکاوی حەبەشە

نووسەر: گاستۆن شروو

وەرگێڕ: زانا شەریفیان

دەمەو بەیانی بوو کە ئێمە گەیشتینە تەنیشت زەلکاو. لمەکانی لێواری زەریا چۆڵ بوو. بە هۆی فەرتەنەکەی دوێشەو زەویەکەی ئێستاش نمی بوو و باڵندەگەلێکی زۆر لەوێ دەبینرا.

لە ناکاو ئاسکە مێوێکی چکۆلە بێ هەرا لە نێو سەوزەکان دەرکەوت و ئەمە سەیر بوو. چونکە ئێستا کاتی ئاو خواردنی ئاسکەکان نەبوو. لمۆزە ڕەش و جوانەکەی بەرز کردبووە و هەوای هەڵدەمژی. گوێ پانەکانی دەجووڵانەوە. کە ئەرخەیان بوو بەرەو ئاوەکە ڕۆیشت، ملی درێژەوە کرد ڕۆیشتە نێو زەلکاوەکە دەستی کرد بە خواردنەوە.

لەم کاتەدا ئێمە بەرزایی ناسرووشتی ژێر زگیمان دی. کاتی زاوزوێی نیزیکە.

زۆر هێواش دەیخواردەوە. جار وا سەری لە ئاوەکە دەهێنا دەرەوە بە جووڵەیەکی تووند و ناکاو کە بەو شێوەیەکی بێ ئۆقرەیی دەدا هەناسەی تازە دەکردەوە.

لە پشت سەریەوە قامیشەکان جووڵانەوە و ئاسکە نێرییەک کە جووتی بوو دەرکەوت. مومویەکی هێواش کە بەچەشنی ورتەیەکی نەرمە بووی کرد. ئاسکە مێوەکە ڕوی وەرگێڕا. ئاسکە نێرییەکە هاتە لای مێوەکەی خۆی. بۆنی کرد لەڕووی بێمەیلییەوە قومێکی ئاو لەگەڵ خواردەوە. هەوەڵ ئاسکە مێوەکە گەڕایەوە، جووتەکەی کەوتە دوای. ئاسکە مێوەکە شوێنێکی لمی هەڵبژارد، دەستەکانی نوشتاندەوە بە پارێزەوە خۆی مۆڵ دا.

شێوەیەک کەوتبوو کە ئێمە بە ڕوونی بەرزایی زگییمان دەدی. بە دووربین، لێوە ڕەشە جوانەکانی ئاژەڵەکە کە بە هێواشی کاوێژی دەکرد دیار بوو. وا وێنا دەکرا کە نیگای دڵ کێشی ئاگای هیچی نەدەکرد.

ئاسکە نێرەکە لە تەنیشتییەوە ڕاوەستا. جارو بار پف پفی دەکرد و کلکە چکۆلەکەی دەجووڵاوە.

ئاسکە مێوەکە دیسان هەستاو ڕۆیشت ئاو بخواتەوە و هەر کەڕەت بۆ شوێنە هەوەڵەکەی دەگەڕایەوەو بەو شێوەیە دەخەوت. ئاسکە نێرەکە لێی جوودا نەدەبووە

و هەر سات و دەنگی ورتەی دەگەیشتە گوێ. کە سەیری جووتەکەی خۆی دەکرد ورتەی دەهات، بۆنی دەکرد دواتر کەمێک دوور دەکەوتەوە. دەگەڕا. سەری دانەوابوو. کەمێک سەوزەڵانی بە ئێشتیای خۆی دۆزییەوە خەریک لەوەڕ بوو.

لە ناکاو ڕێ نوێنی ئێمە کە لە تەنیشت منەوە بوو دای بە هەنیشکما و گوتی.

" دابید"

" دابید یانی مار"

ئەمە مارێک بوو بە ئەندامی ئەژدیها ئاسا.

چۆن هاتۆتە ئەوێ؟ ئایا لە بێشەڵانەوە هاتووە یان لە نێوان دوو بەرد خزیوەتە دەرێ. تا ئێستا لە بن سێبەر خۆی داشاردبوو کە ئێمە نەماندی؟

هێواش تلی دەخوارد، بەشێوەی هەست پێنەکراو وەک بەڵای ناکاو دەخزاو و کاتێک کە لەگەڵ ئاسکە مێوەکە هەنگاوێک دوور بوو لە شوێنی خۆی ماق ما. سەری کە بەرزەوە کردبوو لە پرتاو بەرزی کرد و بە شێوەی دار دەستییەکی قیت دەرهات کە هاو شانی زەوی بوو. ئەندامی درێژی چووە ژوورەوەو گرمۆ لە بوو، بێ جووڵە مایەوە. بە شێوەیەک کە بە دووربینی هەناسە نزمیمان نەماندەتوانی پێی ببەین. ئاسکە مێوەکە سەری وەرگەڕاند و سەیری کرد.

لە دە هەنگاوی دا، جووتە نێرەکەی لەسەر شوێنی خۆی مایەوەو چاوی تێ بڕیبوو. ڕەنگە دەخولەک تێپەڕا. ئێمە لە شوێنێکدا بووین کە نەماندەتوانی بە فیشەک بی پێکین. دواتر ڕێنوێنە خۆیەیکە لە گوێما گوتی.

" دەیخوات. ئێمە زیندوو دەگرین."

لە ناکاو سەری مارەکە وەک تۆپ بە گەردنی ئاسکەکەدا کەوت، ئەم کارە هێندە بە خێرایی پێش هات کە ئێمە لە پەلامارەکەی ئاگادار نەبووینەوە.

پێش هاتێکی سامهێنەر بوو. پەردەی نەماییشە کە دەستی پی کرد:

مار سێ دەور بە دەوری لەشی ئاسکە مێوە خەوتووەکە کە لاقەکانی بە جووڵەی ڕێک و پێک وەک ترپەی دڵ بە دژواری دەجوولاند، داوە.

ئەوکات ئاسکە نێرەکە بە دوو بازی کورت گەیشت. خۆی کۆ کردەوە. سەری خۆی بۆ لای بوونەوەرە خزۆکەکە گرت، پێشەو دواییێکی کرد و شاخێکی لێدا.

ئەژدیهاکە دەمی خۆی لە ملی ڕاوەکەی هەڵگرت، سەری بەرەو بوونەوەرە بێسامەکە گرت و سەیری کرد.

ئاسکە نێرەکە لەسەر جێگاکەی وشک بوو.

بەڵام ئاڵقەکانی مارەکە، ئاسکەکەی دەگووشا، لاقەکانی ڕاوەکە بەرزەوە ببوون و ئیدی نەدەجووڵانەوە.

ئێمە دیمان کە لە لەشە ئەشکەنجە کراوی ئاسکێ مێوەکە، تۆپەڵێکی ڕەش هاتە دەرەوە. کە لە خوێندا دەدرەوشایەوە و کەوتە سەر لمەکان.

ئەژدیها سەری خستە سەر، سەری ئاسکە مێوەکە. وەک ئەوەی بیلاوێنێت. لەشە درێژەکەی بە شێوەیەکی نائاشکرا لەشی ڕاوەکەی داگیر کردبوو بەسەریا قورسایی دەکرد و چاوەڕێی بوو کە ئاڵقەیەکی نوێی پێدا بداتەوە.

تۆپەڵێکی رەنگ ڕەشی چکۆلە دیسان لە لەشی ئاسکە مێوەکە هات دەرەوە بەڵام لە دایک بوونێکی تاڵ پێش نەهات.

لەم کاتەدا ئاسکە مێوەکە ملی بە بێ ئۆقرەیی دەجووڵاند و کۆتایی ئەم پێش هاتە ترس هێنەرە و بێچووی خۆی کە دەجووڵاوە چاو لێدەکرد. دواترچووە پێشەوەو لێسایەوە و ورتەیەکی چکۆلەی کرد.

لەم ماوەیەدا ئەژدیها گووشارەکانی خۆی زۆر کردبوو بێ ئەوەی کە ئێمە ببینین ئەم کارەی چۆن کرد. لەشی بەدەوری ڕاوەکەیەوە وەک فەنەر ئاڵا بوو. سەری بەرەو زەلکاوەکە گرت و بە لەشی خۆی کە ڕاوەکەی تێک دابوو لەگەڵ خۆی دەیکێشا، دەمی ئاواڵەی ئاسکە مێوەکە بە زمانە دەرهاتووەکەیەوە دیار بوو.

بەم شێوەیە دوو بوونەوەرەکە لەشێکیان بوو چوونە نێو ئاوەکە.

ئاسکە نێرەکە جوانارى بێچووەکەی تەواو دەکرد و بە ئاوکە، کە جاروبار نووشتاوی مسی ڕەنگی بوونەوەرەکە لە سەریەوە دەردەکەوت، چاو لێ دەکرد.

ئێمە لە سەیری ئەم دوو دیمەنە لەسەر جێی خۆمان ماق ببووین. پۆلی باڵندەکان دەهاتن ئاویان دەخواردەوە و مەلەیان دەکرد.

سرووشت دیمەنێکی کووژاو و هێمنی بەخۆی گرت بوو.

ئێمە دیمان کە بێچووە ئاسکەکە لەسەر لاق ڕاوەستا. لەسەر لاقەکانی لەتەری دەخوارد. سەری دەجووڵاند وەک ئەوەی کە خۆی بۆ ڕۆیشتن حازر بکات. ئاسکە نێرەکە ئەوی بە لمۆزە نەرمەکەی بەرەو پێش پاڵ دەەنا. دواتر بینایمان ئەژدیها لە ئاو هاتە دەرەوە. نووشتاوەکانی کرانەوە. کلکی بەسەر لمەکەدا دەکێشا و ماوەی لەشی ئاسکە مێوەکە بەدوای خۆی دەهێنا.

کاتێک لەشی ئاسکە مێوەکە دیار کەوت. ئەگەری نەبوو کە شێوەکەی بناسییەوە، سەری نەبوو و ئەندامە جوانەکەی بە ئێسکە ورد کراوەکانی بە شێوەی تەلیسێکی شل و سەر چۆڵ دەرهاتبوو.

ئەژدیها زۆرتر لە کاتژمێرێکی پێچوو کە خواردمەکەی تەواو کات. کەسەکانی ئێمە کە ڕێنوێنەکەمان بانگیانی کردبوو بە قولاپ و گوریس گەیشتن. خزۆڵکەکە وەک مردوو بێ هەست و ماسیو لەسەر خۆ چبوو. دەمی لە کار کەوتبوو، و بێ خوست ببوو.

ڕۆژ کە ئاوا بوو. لەو نیزیکانە لەسەر زەویە خیزەڵانییەکە. جێ پێی مێگەلێک ئاسکامان دۆزییەوە، هەرچەن برێک دوور بوون. بەڵام ئەوانمان دی. پێنج ئاسکە مێو لەگەڵیان بوون کو بێچوەکە بەدوایانەوە هەڵدەهات و بەچکە ئاسکە هەتیوەکە لەگەڵ یەکیان بوو.